بەشێک لە

# كِتَابُ أَحْكَامِ النِّسَاءِ

عَنْ الإِمَامِ أَبِي عَبْدِ اللهِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ

رِوَايَة أَبِي بَكْرٍ الخَلَّالِ رَحِمَهُ اللهُ

پووختەی

# كِتَابُ عِشْرَةِ النِّسَاءِ

لِإِمَامِ أَبِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ أَحْمَد

بْنِ شُعَيْبِ النَّسَائِي رَحِمَهُ اللهُ


عبدالملك الأثري

بەشێک لە

# كِتَابُ أَحْكَامِ النِّسَاءِ

عَنْ الإِمَامِ أَبِي عَبْدِالله أَحْمَد بْن حَنْبَل

رِوَايَة أَبِي بَكْر الخَلَّال رَحِمَهُ اللهُ

پووختەی

# كِتَابُ عِشْرَةِ النِّسَاءِ

لِإِمَامِ أَبِي عَبْدُالرَّحْمٰن أَحْمَد

بْن شُعَيب النَّسَائِي رَحِمَهُ اللهُ

عبدالملك الأثري

ئەم نامیلکەیە بەشێکە لە کتێبی (أحكام النساء عن الإمام أبي عبدالله أحمد بن حنبل رواية الخلال).

زۆربەی ئەثەرەکانی دەربارەی ئایەتی ٣١ ی سوورەتی النور ە، وە تێیدایەتی دەربارەی شێوازی جل و بەرگی ئافرەت و خۆدەرنەخستنیان بەرامبەر پیاوی بێگانە و مندالّی بالّغبوو، وە چەند بابەتێکی تر کە ئافرەتی ئەهلی سوننە پێویستە بیانزانن و جێبەجێیان بکەن.

داواکارین لە الله تعالی ئەم کارە بچووکەمان لێوەربگرێت و تەنها لە پێناو خۆی بووبێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەرەکەی و بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت بووبێت، آمین.

ئایەتی ٣١ ی سوورەتی النور : ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾

## فەرمایشتی : | وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا |



١ - الخلال ئەڵێت : حرب بن إسماعيل هەواڵی پێدام وتی : وترا بە أحمد : پیاوێک لە بازاڕدا بێت، کڕین و فرۆشتن بکات، ئافرەتێک دێت شتی لێ ئەکڕێت، جا دەستی وە نزیک لەوە ئەبینێت .

پێی ناخۆش بوو و وتی : (هەموو شتێکی ئافرەت عەورەتە) .

وترا : دەموچاویش ؟

وتی : (ئەگەر گەنج بوو سەرنجی ڕائەکێشا ئەوە پێم خۆش نییە - **دەموچاوی دەربخات** - ، ئەگەر پیر بێت هیوام وایە کێشەی نەبێت) .

---

**: مەبەستی لە (سەرنجی ڕائەکێشا) ئەوە نییە جوان بێت، بەڵکو هەموو ئافرەتێک کە نەچووبێتە تەمەنەوە سەرنجڕاکێشە .**

**لەم وتەیە و هاوشێوەکانیەوە بۆت دەرئەکەوێت ئافرەتێک کە پیر بووە و بەساڵدا چووە ئەتوانێت تەنها دەموچاوی دەربخات .**

**بەم شێوەیە تەواوی ئەو ئافرەتانەی کە پیر نین و دەموچاویان دەرئەخەن و نیقاب ناکەن حیجابەکەیان وەکو حیجابی ئافرەتانی سەلەفی ئوممەت نییە و کەمتەرخەمی ئەکەن.**

**وە ئەو ئافرەتانەی کە نە نیقاب ئەکەن نە عابا، وە لەسەر ستایل و مۆدێل جل ئەکەنە بەریان، جۆرە حیجابێک ئەکەن پێی ئەوترێت حیجابی تورکی، ئەو جلەی ئەوان ئەیکەنە بەریان تەنها بە ناو حیجابە، لەڕاستیدا هیچ پەیوەندیەکی بەو حیجابەوە نییە کە ئافرەتانی سەلەف کردویانە، با ناوی حیجاب لەو جل و بەرگ و کردارە نەنێن کە ئەیکەن، بەڵکو ناوێکی تازەی بۆ بدۆزنەوە .**

**٢** - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێدام وتی : مهنا بۆی گێڕاینەوە وتی : پرسیارم کرد لە أحمد دەربارەی پیاوێک کە خواردن بخوات لەگەڵ ئەو ئافرەتەی پێشتر هاوسەری بووە بەڵام تەڵاقی داوە ؟

وتی : (نەخێر، ئەو پیاوێکی بێگانەیە، حەڵاڵ نییە بۆی تەماشای بکات، چجای ئەوەی نانی لەگەڵ بخوات، وە تەماشای دەستی بکات! ئەوەی بۆ حەڵاڵ نییە) .

---

**: تەماشا بکە رحمک الله لێرە ئیمام ئەڵیت (وە تەماشای دەستی بکات!)، لێرە باس باسی دەستە، واتە بابەتەکە زۆر لەوە گەورەترە ئەو ئافرەتانە بیری لێ ئەکەنەوە کە تەنها حیجابێکی لەسەر مۆدێل ئەکەن، پیاو نابێت دەستت ببینێت چجای بگات بەوەی ئافرەتان ئەمڕۆ دەری ئەخەن !**

**٣** - الخلال ئەڵێت : منصور بن الوليد هەواڵی پێدام کە جعفر بن محمد بۆی گێڕاونەتەوە وتویەتی : بیستم أبا عبدالله - **واتە ئیمام أحمد** - ئەیوت : (هەموو شتێکی ئافرەت عەورەتە، تەنانەت نینۆکیشی) .

٤ - الخلال ئەڵێت : موسى بن سهل هەواڵی پێدام وتی : محمد بن أحمد الأسدي هەواڵی پێدام وتی : إبراهيم بن يعقوب هەواڵی پێداین لە إسماعيل بن سعيد الشالنجي يەوە کە أبا عبدالله وتی : (جوانی ئاشکرا و دیار، وە جلوبەرگ، وە هەموو شتێکی عەورەتە - واتە ئافرەت -، تەنانەت نینۆکیشی ) .

---

**: عەورەت ئەبێت داپۆشرێت، ئەگەر هەموو شتێکی ئافرەت عەورەت بێت کەواتە ئەبێت هەموو شتێکی خۆی داپۆشێت .**

٥ - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێدام کە مهنا بۆی گێڕاونەتەوە : پرسیارم کرد لە أحمد ئایا ئافرەت خوف ـەکەی داپۆشێت ؟

وتی : (بەڵێ) .

وتم : بۆچی ؟

وتی : (لەبەر ئەوەی قەبارەی قاچی دەرئەخات ) .

---

**: خوف جۆرە شتێکە کە لە چەرم دروست ئەکرێت و لەپێ ئەکرێت، وتەکەی ئیمام بەڵگەکە بۆ ئەوەی ئافرەت ئەبێت جلەکانی هێندە درێژ بن قاچەکانیشی داپۆشێت .**

٦ - الخلال ئەڵێت : أحمد بن محمد بن مطر هەواڵی پێدام وتی : أبو طالب هەواڵی پێداین وتی کە : گوێبیستی أبا عبدالله وتوویەتی : (نینۆکی ئافرەت

عەورەتە، کاتێک چوویە دەرەوە با دەست و نینۆک و خوف ـەکەشی دەرنەخات).

---

**: وتەکەی ئیمام ئاماژەیە بۆ ئەوەی خوشکانی ئەهلی سوننە دەستکێش بکەنە دەستیان، ئەو دەستکێشانە نا کە سەری پەنجەکانیان براوە، بەڵکو ئەوەی کە کاملە .**

٧ - الخلال ئەڵێت : حرب بن إسماعيل الكرماني هەواڵی پێدام وتی : عيسى بن محمد هەواڵی پێدام وتی : إبن أبي مريم هەواڵی پێیدان لە يحيى بن أيوب لە إبن عجلان لە سمي ى مەولای أبو بكر الصديق وتی : (هەموو شتێکی ئافرەت عەورەتە، تەنانەت نینۆکیشی ) .

٨ - الخلال ئەڵێت : محمد بن الحسن بن هارون هەواڵی پێدام وتی : محمد بن الصباح هەواڵی پێداین وتی : عبدالله بن رجاء هەواڵی پێیدان لە إبن عجلان لە سمي لە أبي بكر بن عبدالرحمن وتی : (هەموو شتێکی ئافرەت عەورەتە، تەنانەت نینۆکیشی ) .

## فەرمایشتی : ﴿ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾



**٩** - الخلال ئەڵێت : أحمد بن محمد بن حازم هەواڵی پێداین کە إسحاق بن منصور وتی : پرسیارم لە أحمد کرد : ئایا ئافرەت ئەتوانێت سەری ڕووت بکات لە ماڵەکەیدا ؟

وتی : (بەڵێ) .

**١٠** - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي الوراق هەواڵی پێدام کە مهنا الشامي وتی : پرسیارم کرد لە أحمد دەربارەی ئافرەت ئایا پێویستە لە کاتی شەونوێژدا لە ماڵی خۆیدا دەنگی نزم بکاتەوە لە قورئان خوێندنەوەکەیدا ؟

وتی : (بەڵێ) .

---

**: تەماشا بکە رحمک الله ئافرەت تەنانەت لەکاتی قورئان خوێندن لە ماڵی خۆشیدا پێویستە لەسەری بە دەنگی نزم بیخوێنێتەوە تا پیاوی تر گوێی لێ نەبێت، جا هەموو ئەو تێکەڵاویانەی کە ئەمڕۆ بە ناوی دینەوە هەیە لێکی بدەرەوە بەوە بزانە چەندی شەرعیە! بێگومان هیچی شەرعی نییە .**

فەرمایشتی الله عز وجل : ﴿ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ ﴾



١١ - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێدام وتی : أبو بكر الأثرم هەواڵی پێدام وتی : پرسیارم کرد لە أبا عبدالله .

- وە الحسين بن الحسن هەواڵی پێدام وتی : محمد بن داود هەواڵی پێداین کە پرسیار کرا لە أبا عبدالله دەربارەی پیاوێک تەماشای قژی خێزانی باوکی ئەکات - واتە زڕ دایکی -، وە خێزانی کوڕەکەی، وە دایکی خێزانی ؟

وتی : (ئەوە لە قورئاندایە : ﴿ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ ئیللا بۆ فلان و فلان نەبێت.

محمد وتی : جا ڕوخسەتی دا تەماشای قژیان بکات .

پێم وت : ئایا تەماشای قاچ و سنگی خێزانی باوکی بکات ؟

وتی : (نەخێر، هیچ حەزم پێی نییە، من پێم ناخۆشە تەنانەت بۆ دایک و خوشکی خۆی تەماشای ئەو شتانەی بکات، وە هەر شتێکی کە جێگەی شەهوەتە) .

---

**: واتە پیاو ئەتوانێت تەماشای ئەو شوێنانەی ئافرەتی مەحرەمی خۆی بکات کە شەهوەتی لێوە پەیدا نابێت، وە ناتوانێت تەماشای ئەو شوێنانەیان بکات کە شەهوەتی لێوە پەیدا ئەبێت، واللە أعلم .**

**کە ئەوترێت ئافرەتی مەحرەم مەبەست پێی دایک و خوشک و پوور و زڕدایک و زڕخوشک و خوشکەزا و برازا و . . . ئەوانەیە، نەوەک ژنی پیاوەکە خۆی .**

## فەرمایشتی : ﴿ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ ﴾



١٢ - الخلال ئەڵێت : محمد بن أبي هارون هەواڵی پێدام وتی کە إسحاق بن إبراهيم هەواڵی پێداون وتوویەتی : پرسیارم کرد لە أبا عبدالله دەربارەی ئافرەتێکی موسوڵمان کە ئایا سەری ڕووت بکات لەلای ئافرەتانی ئەهلی الذمة ؟ - واتە ئافرەتانی یەهوودی و نەسڕانی -

وتی : (بۆی حەڵاڵ نییە سەری ڕووت بکات لەلای ئافرەتانی ئەهلی الذمة ، چونکە الله ئەفەرمووێت : ﴿ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ ﴾ .

وە بیستم أبو عبدالله پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەم ئایەتە : ﴿ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ ﴾ .

وتی : (ئافرەتانی ئەهلی کتاب یەهودی و نەسڕانیەکان ماچی ئافرەتی موسوڵمان ناکەن ، وە تەماشای ناکەن) .

١٣ - الخلال ئەڵێت : أحمد بن محمد بن مطر هەواڵی پێدام وتی : أبو طالب هەواڵی پێداین کە أبو عبدالله وتی : (ئافرەتانی ئەهلی کتاب تەماشای قژیان ناکەن ، - واتە قژی ئافرەتی موسوڵمانان - ، مكحول وای وتووە - وە باسی زیاتر لە یەک کەسی کرد) .

**: ئەگەر ئافرەتێکی ئەهلی کتاب کە لەگەڵ ئافرەتێکی موسوڵماندا هەمان ڕەگەزیان هەیە نەتوانێت تەماشای قژی بکات، ئەوکات چۆن ئەکرێت پیاوێکی نامەحرەم تەماشای قژی ئافرەتێکی موسوڵمان بکات؟ بەڕاستی شتی لەو جۆرە نابێت .**

١٤ - عبدالملك الميموني ئەڵێت : . . . أبو عبدالله تۆ پێت خۆش نییە ئافرەتێکی نەسڕانی یان یەهودی تەماشای ئافرەتێکی موسوڵمانی ئێمە بکات؟

وتی : (بەڵێ پێم ناخۆشە) .

فەرمایشتی : ﴿ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ﴾



١٥ - الخلال ئەڵێت : محمد بن أبي هارون هەواڵی پێدام کە إسحاق بن إبراهيم هەواڵی پێداون کە وتوویەتی : وتم بە أبو عبدالله : ئایا بەندە تەماشای دەموچاو و دەستی خاوەنەکەی ئەکات ؟

وتی : (تەماشای دەموچاو و دەستی ناکات) .

---

**: مەبەستی لەوەیە ئافرەتێک بەندەیەکی پیاو یان کوڕی هەبێت .**

١٦ - الخلال ئەڵێت : الحسن بن سفيان المصيصي هەواڵی پێداین وتی : محمد بن آدم بن سليمان هەواڵی پێداین وتی : محمد بن ميسر هەواڵی پێداین لە إبن جريج لە أبي الزبير لە جابرەوە کە : (ڕقی لەوە بوو کە بەندە تەماشای قژی خاوەنەکەی بکات، وە - **ئافرەت** - خیمارەکەی لا ببات لەلات بەندەی هاوسەرەکەیدا) .

١٧ - الخلال ئەڵێت : عبدالله بن أحمد هەواڵی پێدام وتی : گوێم لە باوکم بوو وتی : (بەندە تەماشای قژی خاوەنەی ناکات) .

١٨ - الخلال ئەڵێت : عبدالله هەواڵی پێداین وتی : باوکم هەواڵی پێدام وتی : عبدالرحمن بن مهدي هەواڵی پێداین لە سفیان ـەوە لە لیث ـەوە لە مجاهد و طاوس ـەوە لە : (پێیان خۆش نەبووە بەندە تەماشای قژی خاوەنەکەی بکات، وە طاوس پێی خۆش نەبووە تەماشای قژی کچەکەی یان خوشکی بکات) .

١٩ - الخلال ئەڵێت : محمد بن عمر هەواڵی پێدام وتی : گوێبیستی براکەم أبا علي بووم وتی : بشر - الحافي - بە خوشکەکەی وت : (مەیەرە ژوورەوە بۆ لام ئیللا بە نیقابەوە نەبێت) .

٢٠ - الخلال ئەڵێت : عبدالملک المیموني هەواڵی پێدام وتی : أحمد بن شبیب البصري هەواڵی پێدام وتی : باوکم هەواڵی پێداین وتی : یونس بن یزید هەواڵی پێداین لە محمد بن مسلم لە إبن المسیب ـەوە کە ئەڵێت : (پیاو مۆڵەت وەرئەگرێت بۆ چوونە لای دایکی، چونکە ئەمە : | وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَٰلُ مِنكُمُ ٱلۡحُلُمَ فَلۡيَسۡتَـٔۡذِنُواْ | (النُّور : ٥٩) دەربارەی دابەزیوە .

---

**: ئەم کۆمەڵە ئەثەرە و چەندین ئەثەری تری سەلەف رحمهم الله تعالی ئەوەمان پیشان ئەدەن کە ئافرەتی ئەهلی سوننە ئەبێت ئاگادار بێت دەموچاو و دەست و جوانیی خۆی بۆ کێ دەرئەخات .**

## فەرمایشتی : ﴿ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ ﴾



٢١ - الخلال ئەڵێت : عبدالله بن أحمد بن حنبل وتی : پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی ﴿ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ ﴾ .

وتی : أبو أحمد و أسود بن عامر هەواڵیان پێداین لە إسرائيل لە أبي إسحاق لە کەسێکەوە کە لێوەی گێڕاوەتەوە لە إبن عباس ـەوە دەربارەی وتەی ﴿ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ ﴾ .

کە ئەفەرمووێت : (ئەوانەی - ئەو پیاوانەی - کە ئافرەتان شەرمی لێ ناکەن).

٢٢ - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێدام وتی : مهنا هەواڵی پێداین وتی : إبراهيم بن الحكم بن أبان هەواڵی پێداین لە باوکیەوە لە عكرمة ـەوە لە إ بن عباس ـەوە دەربارەی فەرمایشتی ﴿ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ ﴾ .

ئەفەرمووێت : (ئەوە نێرەموکە کە ئەندامی نێرینەی کار ناکات) .

**٢٣** - الخلال ئەڵێت عبدالله هەواڵی پێداین وتی : باوکم هەواڵی پێدام وتی : إسماعيل هەواڵی پێداین وتی : إبن أبي نجيح هەواڵی پێداین لە مجاهد ـەوە کە ئەڵێت : (ئەوەی کە هیچ پێویستیەکی بە ئافرەت نییە) .

**٢٤** - الخلال ئەڵێت : عبدالله هەواڵی پێداین وتی : باوکم بۆی گێڕاینەوە وتی : وكيع بۆی گێڕاینەوە وتی : مسعر بۆی گێڕاینەوە لە عون لە عكرمة کە ئەڵێت : (ئەوەی - **ئەو پیاوەی** - کە ئەندامی نێرینەی کار ناکات).

فەرمایشتی : | أَوِ ٱلطِّفْلِ |



٢٥ - الخلال ئەڵێت : زكريا بن يحيى و أحمد بن محمد بن مطر هەواڵیان پێدام أبا طالب هەواڵی پێداون کە وتوویەتی : پرسیارم کرد لە أبا عبدالله : کەی ئافرەت سەری دائەپۆشێت بەرامبەر منداڵی کوڕ ؟

وتی : (ئەگەر گەیشتە دە ساڵی، لێی ئەدرێ لەسەر نوێژ، وە عەقڵی پەیدا کرد، سەری دائەپۆشێت ئەگەر بوو بە دە ساڵ) .

٢٦ - الخلال ئەڵێت : عبدالملک بن عبدالحميد الميموني هەواڵی پێدام کە پرسیاری کردووە لە أبا عبدالله دەربارەی منداڵی کوڕ لە دە ساڵیدا ؟

ئەویش وتوویەتی : (لە دە ساڵیدا لەسەر نوێژ لێی ئەدرێت) .

وتم : لە دە ساڵیدا جێگەی نووستنیان جیا ئەکرێتەوە ؟

وتی : (بەڵێ، ئەگەر لێیان بدرێت لەسەر نوێژ ئەوە جێخەوەکانیان جیا ئەکرێتەوە) .

٤٧ - الخلال ئەڵێت : جعفر بن محمد هەواڵی پێدام كە يعقوب بن بختان هەواڵی پێداون كە أبا عبدالله پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئەوەی کە چ کاتێک فەرمان ئەکرێت بە نوێژکردن ؟

وتی : (فەرمان ئەکرێت بە نوێژکردن لە حەوتساڵیدا، وە لە دە ساڵیدا لێی ئەدرێت لەسەری، وە جێخەوەکانیان جیا ئەکرێتەوە) .

٤٨ - الخلال ئەڵێت : عبدالله بن محمد بن عبدالحميد هەواڵی پێدام وتی : بكر بن محمد هەواڵی پێداین وتی : أبو عبدالله پرسیاری لێ کرا : منداڵی کوڕ لە کەیدا فەرمانی پێ ئەکرێت بە نوێژکردن ؟

وەڵامی دایەوە پاشان وتی : (لە دە ساڵیدا جێخەوەکانیان لەیەک جیا ئەکرێتەوە، منداڵی کوڕ لە منداڵی کوڕ، وە منداڵی کچ لە منداڵی کچ) .

٤٩ - الخلال ئەڵێت : أبو داود هەواڵی پێداین وتی : گوێبیستی أحمد بووم وتی : (پیاو کچی خۆی ئەشوات ئەگەر بچووک بێت، وە ئافرەت منداڵی خۆی ئەشوات مەگەر گەیشتبێتە حەوت ساڵی) .

وتم : منداڵی کوڕی بچووک دائەپۆشرێت وەک چۆن گەورە دائەپۆشرێت ؟ مەبەستم مردوو بوو .

وتی : (چ شتێکی دائەپۆشرێت لەکاتێکدا عەورەتی عەورەت نییە! بەڵکو ئافرەتان ئەیشۆن) .

وتم بە أحمد : منداڵی کوڕ کەی دائەپۆشرێت ؟

وتی : (کاتێک گەیشت بە حەوت ساڵی) .

٣٠ - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێداین وتی : مهنا هەواڵی پێداین کە پرسیاری لە أبا عبدالله کردووە وتوویەتی : کێشە نییە ئەگەر تەماشای عەورەتی منداڵی کوڕ بکرێت؟ وە بۆم گێڕایەوە کە رسول الله ﷺ تەماشای زەکەری کوڕەکەی کردووە .

وتی : (بەڵێ) .

فەرمایشتی : ﴿ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ﴾



**٣١** - الخلال وتی : حرب بن إسماعیل هەواڵی پێدام کە پرسیار کراوە لە أبا عبدالله دەربارەی ئافرەتێک کە ئاڵتوونێکی زۆری پێوەیە ؟

وتی : (ئەگەر دەری نەخات) .

**٣٢** - الخلال ئەڵێت : محمد بن علي هەواڵی پێدام وتی : أبو بكر الأثرم هەواڵی پێداین وتی : پرسیارم کرد لە أبو عبدالله : دەربارەی ئاڵتوون بۆ ژنان ئەڵێیت چی ؟ وتی : (بۆ ئافرەتان ڕێگەپێدراوە ئەگەر تەنها بۆ هاوسەرەکەی خۆیی دەربخات) .

وتم : جا چۆن ئەتوانێت دەری نەخات ؟

وتی : (بۆ هاوسەرەکەیی دەرئەخات، مستیلەیەکی ئاڵتوونە، دەستی دائەپۆشێت تەنها لەلای پیاوەکەیدا نەبێت) .

**٣٣** - الخلال ئەڵێت : محمد بن الحسين هەواڵە پێدام الفضل بن زياد هەواڵی پێداون کە گوێبیستی أبو عبدالله بووە پرسیاری لێکراوە : چی ئەڵێیت دەربارەی ئاڵتوون بۆ ئافرەتان ؟

وتی : (ئەگەر دەرینەخات هیوادارم هیچ کێشەیەکی نەبێت ) .

پێم وت : ئەی چۆن داپۆشێت ؟

وتی : (دایبپۆشێت ، تەنها لەلای هاوسەرەکەیدا دەریبخات ) .

**: واتە ئەتوانێت هەمیشە ئاڵتوونی پێوە بێت، بەڵام با تەنها بۆ مێردەکەی خۆیی دەربخات .**

**بەڵام والله المستعان لە کۆمەڵگای جاهیلیەتی ئەمڕۆدا پیاو چەندین ساڵ خۆی ماندوو ئەکات هەتا پارە پەیدا بکات و بیدات بە مارەیی بۆ خێزانی پاشان پیاوانی تریش بەشدار ئەبن لە بینینی ئەو جوانیەی کە تەنها ئەو ڕێگەپێدراوە بیبینێت .**

**٣٤** - الخلال وتی : محمد بن جعفر هەواڵی پێدام وتی : أبو الحارث هەواڵی پێداین کە أبو عبدالله پرسیاری لێکرا دەربارەی ئاوریشم و ئاڵتوون ؟

وتی : (ئافرەت لە ماڵەوە لەبەری ئەکات، وە دەریناخات بۆ بێجگە لە مێردەکەی، من ئەوەم پێ خۆش نییە، مەگەر لە ماڵی خۆیدا لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بێت ) .

**: وتەی (مەگەر لە ماڵی خۆیدا لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بێت) واتە ئافرەتەکە و هاوسەرەکەی لە ماڵی باوکی کچەکەدا بژین .**

**٣٥** - الخلال ئەڵێت : أحمد بن محمد بن حازم هەواڵی پێدام وتی کە إسحاق بن منصور بۆی گێڕاونەتەوە کە پرسیار لە أبو عبدالله کراوە دەربارەی ئاڵتوون بۆ ئافرەتان ؟

وتی : (هیوادارم کێشەی نەبێت ، بەڵام ئاڵتوونەکە دەرنەخات) .

**٣٦** - الخلال ئەڵێت : محمد بن الحسين هەواڵی پێدام کە الفضل بن زیاد هەواڵی پێداون وتوویەتی : باسی فەرموودەی هاوسەرگیری کرا و گوێبیستی أبا عبدالله بووم وتی : سفیان بۆی گێڕاینەوە لە إبراهیم بن میسرة لە طاوس کە وتوویەتی : رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هیچ شتێک نەبینراوە وەکو هاوسەرگیری بێت بۆ دوو کەس کە یەکیان خۆش ئەوێت) .

**٣٧** - الخلال ئەڵێت : عبدالله بن أحمد بن حنبل هەواڵی پێداین وتی : پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی چوونەدەرەوەی ئافرەتان لە جەژندا ؟

وتی : (ئەمما لەم سەردەمەی ئێمەدا نەخێر ، چونکە ئافرەتان فیتنەن) .

**٣٨** - الخلال ئەڵێت : حرب بن إسماعيل الكرماني هەواڵی پێدام وتی : پرسیارم کرد لە أحمد وتم : ئافرەتان ئەڕۆنە دەرەوە لە جەژندا ؟

وتی : (لەم سەردەمەی خۆماندا پێم باش نییە ، چونکە ئافرەتان فیتنەن).

والحمد لله رب العالمين

# پوختەی

# كتاب عِشرةُ النِّساء : مامەڵە و تێکەڵاوی کردن لەگەڵ ئافرەتاندا

لإمام أحمد بن شعيب النسائي (٢١٥ - ٣٠٣ هـ)

ئەم کتێبە (عِشرةُ النِّساء : مامەڵە و تێکەڵاوی کردن لەگەڵ ئافرەتاندا) بەشێکە لە کتێبی السنن ی ئیمام أحمد بن شعيب النسائي (**٢١٥ - ٣٠٣** ﻫ) رحمه الله .

به پلەی یەکەم هاوسەران ئەتوانن سوود لەم نامیلکەیە ببینن، وە به پێویستی ئەزانم بڵێم که (فەرموودە و سوودەکانی ناو ئەم کتێبە تەنها بۆ خوێندنەوە نییە، بەڵکو بۆ کارپێکردنیشە) .

الله تعالى ڕەحم بە ئێمە و ئێوەش بکات تێبفکرن و بکۆڵنەوە و بزانن که چ سیفەتێکی باش هەیە لە فەرموودەکاندا و هەوڵ بدەن یەکە یەکە لە خۆتاندا پەرەی پێ بدەن .

وە هەر سیفەتێک بە باشی وەسف نەکرابوو ئەوە هەوڵ بدە خۆتی لێ بەدوور بگریت .

وە بزانن کە تاکە ڕێگای خۆشبەختی هاوسەرایەتی لە ڕێگەی قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت بەدەست دێت .

چاوەڕێ مەکە کەسی بەرامبەرت خۆی باش بکات هەتا تۆ خۆت باش بکەیت، بەڵکو تۆ دەستپێشخەری بکە با بەرامبەر هەست بکات و ئەجرەکە بۆ تۆ بێت .

لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن .

## باب (حُبِّ النِّسَاءِ : خۆشویستنی ئافرەتان)



١ - حَدَّثَنِي الشَّيْخُ الإِمَامُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ النَّسَائِيُّ قَالَ : أَخْبَرَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ عِيسَى الْقُومَسِيُّ قَالَ : حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ : حَدَّثَنَا سَلاَّمٌ أَبُو الْمُنْذِرِ عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (حُبِّبَ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاَةِ) .

- رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (لە دنیا ئافرەت و بۆنی خۆش خۆشەویستكراوە لەلام، وە ڕۆشنایی چاوەكانم كراوەتە نوێژەوە) .

---

**: پێویستە ئافرەتان گرنگیەكی باش بدەن بە بۆخۆشكردنی خۆیان بۆ هاوسەرەكانیان چونكە زیاتر لەلای خۆشەویست و دڵگیرتر ئەبن، وە پێویستە پیاوانیش بە هەمان شێوە گرنگی بە پاكوخاوێنی و بۆخۆشیان بدەن .**

٢ - أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ الطُّوسِيُّ قَالَ : حَدَّثَنَا سَيَّارٌ قَالَ : حَدَّثَنَا جَعْفَرٌ قَالَ : حَدَّثَنَا ثَابِتٌ عَنْ أَنَسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (حُبِّبَ إِلَيَّ النِّسَاءُ وَالطِّيبُ وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاَةِ) .

- رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئافرەت و بۆنی خۆش خۆشەویستکراوە لەلام، وە ڕۆشنایی چاوەکانم کراوەتە نوێژەوە) .

٣ - أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَفْصِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ : حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ : حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ : (لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ النِّسَاءِ مِنَ الْخَيْلِ).

- أنس بن مالک رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (لە پاش ئافرەت هیچ شتێک خۆشەویستتر نەبووە بەلای رسول الله ەوە ﷺ لە ئەسپ) .

---

: ئەگەر هەر ئافرەتێک باش بێت بۆ هاوسەرەکەی بەو شێوەیەی کە شەرع داوای لێکردووە ئەوە هیچ شتێک نییە لەلای خۆشەویستتر بێت لە خێزانەکەی .

## باب (مَيْلِ الرَّجُلِ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ دُونَ بَعْضٍ: گرنگیدانی زیاتری پیاو بە ژنێکی لە ژنێکی تری)



٤ - أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ : حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ قَالَ : حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (مَنْ كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ يَمِيلُ لِإِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَدُ شِقَّيْهِ مَائِلٌ) .

- رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هەر کەسێک دوو ژنی هەبێت گرنگی بە یەکێکتان بدات زیاتر لەوەی تریان ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و یەکێک لە لایەکانی نزمترە - واتە خواروخێچە - ) .

---

: گرنگی پێدان و خۆشویستن جیاوازە لە یەکتری، خۆشویستن بە دەستی پیاوەکە خۆی نییە، ئەگەر ژنێکیان باش بێت لەگەڵی و ئەوی تریان خراپ بێت ئەوە ئەو ژنەیانی زیاتر خۆشئەوێت کە باشترە لەگەڵی زیاتر لەوەی کە خراپە .

بەڵام گرنگی پێدان ئەوەیە کە شتێکت کڕی بۆ هەردووکیان بکڕیت، وە نازی هەردووکیان وەکو یەک هەڵبگریت، وە بە هەمان شێوە لە شتەکانی تردا .

٥ - أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ : حَدَّثَنَا يَزِيدُ قَالَ : أَنْبَأَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَائِهِ ثُمَّ يَعْدِلُ، ثُمَّ يَقُولُ : (اللَّهُمَّ هَذَا فِعْلِي فِيمَا أَمْلِكُ فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ) .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : رسول الله ﷺ شەوەکانی دابەش ئەکرد بەسەر خێزانەکانیدا، پاشان دادپەروەر ئەبوو، دواتر ئەیفەرموو : (ئەی پەروەردگارم ئەمە کار و کردەوەی منە لەوەندەی کە خاوەنیم، جا لۆمەم مەکە لەوەدا کە تۆ خاوەنیتی و من خاوەنی نیم) .

---

**: (شەوەکانی دابەش ئەکرد بەسەر خێزانەکانیدا، پاشان دادپەروەر ئەبوو) واتە شەوی زیاتری ئەدا بە دانەیەکیان لەچاو دانەیەکی تر، چونکە خێزانی وای هەبووە سەرو ٦٠ ساڵ بووە، جا ئافرەتی لەو جۆرە لەڕووی جەستەییەوە کەمتر پێویستی بە پیاوە لەچاو خێزانێکی تری کە تەمەنی کەمتر بووە، والله أعلم .**

## باب (حُبّ الرَّجُلِ بَعْضَ نِسَائِهِ أَكْثَرَ مِنْ بَعْضٍ: خۆشویستنی پیاو بۆ یەكێك لە ژنەكانی زیاتر لەوانی تر)



٦ - أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ قَالَ : حَدَّثَنَا عَمِّي قَالَ : حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ صَالِحٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ : أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ : أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيْهِ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ مَعِي فِي مِرْطِي، فَأَذِنَ لَهَا .

فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي إِلَيْكَ يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ .

وَأَنَا سَاكِتَةٌ .

فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (أَيْ بُنَيَّةُ أَلَسْتِ تُحِبِّينَ مَنْ أُحِبُّ ؟) .

قَالَتْ : بَلَى .

قَالَ : (فَأَحِبِّي هَذِهِ) .

فَقَامَتْ فَاطِمَةُ حِينَ سَمِعَتْ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَجَعَتْ إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَتْهُنَّ بِالَّذِي قَالَتْ وَالَّذِي قَالَ لَهَا .

فَقُلْنَ لَهَا مَا نَرَاكِ أَغْنَيْتِ عَنَّا مِنْ شَيْءٍ فَارْجِعِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُولِي لَهُ إِنَّ أَزْوَاجَكَ يَنْشُدْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ .

قَالَتْ فَاطِمَةُ : لاَ وَاللَّهِ لاَ أُكَلِّمُهُ فِيهَا أَبَدًا .

قَالَتْ عَائِشَةُ : فَأَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَنْزِلَةِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ أَرَ امْرَأَةً قَطُّ خَيْرًا فِي الدِّينِ مِنْ زَيْنَبَ، وَأَتْقَى لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَأَصْدَقَ حَدِيثًا، وَأَوْصَلَ لِلرَّحِمِ، وَأَعْظَمَ صَدَقَةً، وَأَشَدَّ ابْتِذَالاً لِنَفْسِهَا فِي الْعَمَلِ الَّذِي تَصَدَّقُ بِهِ وَتَقَرَّبُ بِهِ، مَا عَدَا سَوْرَةً مِنْ حِدَّةٍ كَانَتْ فِيهَا تُسْرِعُ مِنْهَا الْفَيْأَةَ .

فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ عَائِشَةَ فِي مِرْطِهَا عَلَى الْحَالِ الَّتِي كَانَتْ دَخَلَتْ فَاطِمَةُ عَلَيْهَا فَأَذِنَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي ابْنَةِ أَبِي قُحَافَةَ .

وَوَقَعَتْ بِي ، فَاسْتَطَالَتْ وَأَنَا أَرْقُبُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَرْقُبُ طَرْفَهُ هَلْ أَذِنَ لِي فِيهَا ، فَلَمْ تَبْرَحْ زَيْنَبُ حَتَّى عَرَفْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَكْرَهُ أَنْ أَنْتَصِرَ ، فَلَمَّا وَقَعْتُ بِهَا لَمْ أَنْشَبْهَا بِشَيْءٍ حَتَّى أَنْحَيْتُ عَلَيْهَا .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (إِنَّهَا ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ) .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ فاطمة ی کچی پێغەمبەریان نارد بۆ لای پێغەمبەر ، داوای مۆڵەتی لێ کرد و ئەویش لەگەڵمدا ڕاکشابوو لە ژێر لێفەیەکەدا ، جا مۆڵەتی دا .

وتی : ئەی رسول الله خێزانەکانت ناردوویانم بۆ لات داوای دادپەروەریت لێ ئەکەن لە کچەکەی أبي قحافة ـدا - **واتە لە خۆشەویستی عائشة رضي الله عنها** - .

منیش بێدەنگ بووم ، رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (ئەی کچی خۆم ئایا ئەوەت خۆش ناوێت کە من خۆشمەوێت ؟) .

وتی : بەڵێ .

فەرمووی : (دەی ئەمەت خۆش بووێت - **واتە عائشة رضي الله عنها** - ) .

کاتێک فاطمة ئەمەی بیست لە رسول الله ﷺ هەستا و گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ جا هەواڵی پێدان دەربارەی ئەوەی کە وتی و ئەوەی کە پێی وت .

جا پێیان وت : وا نازانین هیچ سوودێک هەبووبێت لەمەدا ، بگەڕێرەوە بۆ لای رسول الله ﷺ و پێی بڵێ کە خێزانەکانت داوای دادپەروەریت لێ ئەکەن لە کچەکەی أبي قحافة ـدا .

فاطمة وتی : نەخێر سوێند بە الله هەرگیز لەوبارەیەوە قسەی لەگەڵدا ناكەمەوە .

عائشة وتی : جا هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ زینب ی كچی جحش یان نارد بۆ لای رسول الله ﷺ، ئەو لە ئاستی مندا بوو لەناو هاوسەرەكانی پێغەمبەردا ﷺ لە پێگە و پلەدا لەلای رسول الله ﷺ، وە هەرگیز ئافرەتێكم نەبینیوە لە دینداریدا لە زینب باشتر بێت، وە خاوەنی تەقوای زیاتر بێت بۆ الله عز وجل، وە ڕاستگۆتر بێت، وە گەیەنرتر بێت بۆ پەیوەندی خزمایەتی، وە بەخشینی زیاتر بێت، وە خۆی زیاتر بە كەم بزانێت لەو بەخشینەی كە ئەیكرد و خۆی پێ نزیك ئەكردەوە، تەنها ئەوە نەبێت تۆزێك زوو تووڕە ئەبوو لەبەر ئەو توندیەی كە تێیدا بوو، وە بە زوویش پەشیمان ئەبوویەوە لە تووڕەبوونەكەی.

جا داوای مۆڵەتی لە رسول الله ﷺ كرد و رسول الله ش ﷺ لەگەڵ عائشة دا بوو لەژێر لێفەدا بەو شێوەیەی كە فاتمە هاتە ژوورەوە، رسول الله ﷺ مۆڵەتی دا .

وتی : ئەی رسەك الله هاوسەرەكانت ناردوویانم داوای دادپەروەریت لێ ئەكەن لە كچەكەی أبي قحافة دا .

وە قسەی پێ وتم و درێژەی پێدا و منیش سەیری رسول الله م ﷺ ئەكرد، وە چاودێری ئەوەم ئەكرد ئایا دەربارەی ئەو مۆڵەتم پێ ئەدات -واتە وەڵامی بداتەوە- .

جا زینب شوێنەكەی بەجێ نەهێشت هەتا زانیم رسول الله ﷺ پێی ناخۆش نییە بەرگری لە خۆم بكەم، كاتێك ڕووبەڕووی بوومەوە مۆڵەتی هیچم پێنەدا هەتا سەركەوتم بەسەریدا .

پاشان رسول الله ﷺ فەرمووی: (ئەوە کچی ئەبو بکر ە).

**: هاوسەرانی رسول الله ﷺ داوای لێ ئەکەن کە چۆن عائشة ی زۆر خۆش ئەوێت بە هەمان شێوە ئەوانیشی زۆر خۆش بووێت، بەڵام ئەمە شتێک نییە کە لە دەسەڵاتی مرۆڤەکاندا بێت.**

**وە خوشکانی بەڕێز پێویستە چاو لەو خو و ڕەوشتە جوانانە بکەن کە لە دایکی ئیمانداران زینب ی کچی جحش ـدا رضي الله عنه هەبووە و شوێنی بکەون:**

**- زۆری خواپەرستی و عیبادەتکردن.**

**- هەبوونی تەقوای الله عز وجل و ترسان لێی.**

**- ڕاستگۆیی.**

**- گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی.**

**- بەخشین و خێر کردن.**

**- خۆبەکەمزانین.**

**- زوو پەشیمان بوونەوە لە تووڕە بوون.**

**وە ئەبێت خوشکان ئاگاداری ئەوە بن کە نابێت هیچ شتێک وایان لێ بکات دەنگ بەسەر هاوسەرەکانیاندا بەرز بکەنەوە، وە ئەگەر دەنگیشیان بەرز کردەوە وا باشترە برایان صبر بگرن و وەڵام نەدەنەوە هەتا ئافرەتەکە ئەوەی لە دڵیدایە لە خەم و خەفەت دەری ئەبڕێت.**

**لەم حاڵەتانەدا دەست لێ بەرزکردنەوە زیاتر دڵی ئافرەتەکە ئەشکێنێت، وە وەڵامدانەوە و موناقەشە سوودی نییە چونکە ئافرەتان لەکاتی ئاساییدا کەللـەڕەقیەکیان**

**تێدایە، جا لەكاتی هەڵچووندا ئەوە زیاد ئەكات و موناقەشە هیچ سوودێكی نابێت و ئەكرێت سەربكێشێت بۆ دەمە دەمە و قسەی خراپتر و تووڕەبوونی هاوسەرەكەی .**

**لەبەر ئەوە باشترین شت لەم حاڵەتانەدا بێدەنگ بوونە تەنها لەو كاتانەدا نەبێت كە ئافرەتەكە لە سنووری خۆی دەرئەچێت و وەكو ئەڵێن (بێتامی ئەكات)، والله أعلم .**

٧ - أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مَسْعُودٍ قَالَ : حَدَّثَنَا بِشْرٌ - يَعْنِي ابْنَ الْمُفَضَّلِ- قَالَ : حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ عَنْ مُرَّةَ عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ) .

- رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (فەزڵ و پێگەی عائشة بەسەر ئافرەتانەوە وەكو فەزڵ و پێگەی تێگوشە وایە بەسەر خواردنەكانی تردا) .

٨ - أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ إِسْحَاقَ الصَّغَانِيُّ قَالَ : حَدَّثَنَا شَاذَانُ قَالَ : حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (يَا أُمَّ سَلَمَةَ لاَ تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ فَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا أَتَانِي الْوَحْيُ فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ إِلاَّ هِيَ) .

- رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەی أم سلمة ئازارم مەدە بەهۆی عائشة ەوە، سوێند بە الله وەحیم بۆ نەهاتووە كاتێك لەژێر لێفەی هیچ ژنێك لە ئێوە ئیللا لە هی ئەمدا نەبێت) .

---

**: وەكو لە فەرموودەكەی پێشووتردا ئاماژەی پێدرا یەكێك لە هۆكارەكانی خۆشویستنی زۆری رسول الله ﷺ بۆ دایكی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها ئەوەیە كە كچی خۆشەویسترین هاوەڵیەتی .**

**وە تەنها لەژێر پێخەوی ئەودا وەحی بۆ هاتووە .**

**وە جبریل سەلامی لێ ئەکات وەک چۆن لە فەرموودەکانی دواتردا دێت .**

**بەم جۆرە بۆت دەرئەکەوێت کە ڕافیزە کافرە بە لەعنەت بووەکان چەندە کافرن کە دایکی ئیمانداران عائشة لە کافر و زیناکار ئەزانن لە کاتێکدا خۆشەویستترین کەسە لەلای ﷺ .**

**وە خوشکان ئەبێت تێبفکرن کە رسول الله ﷺ لەناو ئەم هەموو هاوەڵە گەورەکان و تەواوی خێزانەکانیدا عائشة بەلایەوە خۆشەویستترین کەس بووە، جا ئەگەر خوشکانیش بەو شێوەیەی کە شەرع داوای کردووە دڵی مێردەکانیان ڕابگرن و لەگەڵیاندا باش بن ئەبن بە مایەی چاوگەشی و ئاسوودەیی و حەوانەوەیان .**

**٩** - أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ : أَنْبَأَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ : حَدَّثَنَا هِشَامٌ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : (كَانَ النَّاسُ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) .

- عائشة رضي الله عنه فەرمووی : (خەڵکی لە سەرەی عائشة دا دیاریەکانیان ئەهێنا، مەبەستیان لەوە ڕەزامەندی رسول الله ﷺ بوو) .

---

**: چونکە ئەزانن خۆشەویستترین کەسە لەلای .**

١٠ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ آدَمَ عَنْ عَبْدَةَ عَنْ هِشَامٍ عَنْ صَالِحِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ هُدَيْرٍ عَنْ عَائِشَةَ : قَالَتْ أَوْحَى اللَّهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَعَهُ، فَقُمْتُ فَأَجَفْتُ الْبَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فَلَمَّا رُفِّهَ عَنْهُ قَالَ لِي : (يَا عَائِشَةُ إِنَّ جِبْرِيلَ يُقْرِئُكِ السَّلاَمَ) .

- عائشة رضي الله عنها ئه‌ڵێت : الله وه‌حی كرد بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ و منیش له‌گه‌ڵیدا بووم، هه‌ستام درگاكه‌ی نێوان خۆم و خۆیم داخست، كاتێک وه‌حیه‌كه‌ ته‌واو بوو پێی فه‌رمووم : (ئه‌ی عائشة جبریل سه‌لامت لێ ئه‌كات) .

١١ - أَخْبَرَنَا نُوحُ بْنُ حَبِيبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ : حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا : (إِنَّ جِبْرِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ) .

قَالَتْ : وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ تَرَى مَا لاَ نَرَى .

- له‌ عائشة ـه‌وه‌ كه‌ : پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی فه‌رموو : (ئه‌وه‌ جبریل سه‌لامت لێ ئه‌كات) .

ئه‌ویش وتی : وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، ئه‌وه‌ ئه‌بینیت كه‌ ئێمه‌ نایبینین .

## باب (الْغَيْرَة: غیرەكردن)



١٢ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ قَالَ : حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ قَالَ : حَدَّثَنَا أَنَسٌ قَالَ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأَرْسَلَتْ أُخْرَى بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتْ يَدَ الرَّسُولِ فَسَقَطَتِ الْقَصْعَةُ فَانْكَسَرَتْ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْكِسْرَتَيْنِ فَضَمَّ إِحْدَاهُمَا إِلَى الأُخْرَى، فَجَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ وَيَقُولُ : (غَارَتْ أُمُّكُمْ كُلُوا) .

فَأَكَلُوا فَأَمْسَكَ حَتَّى جَاءَتْ بِقَصْعَتِهَا الَّتِي فِي بَيْتِهَا فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ إِلَى الرَّسُولِ وَتَرَكَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْهَا .

- أنس بن مالک رضي الله عنها ئەڵێت : پێغەمبەر لەلای یەكێک لە دایكی ئیمانداران بوو، وە یەكێكی تر لە خێزانەكانی قاپێكی بۆ نارد كە خواردنی تێدا بوو، ئەویش دای لە دەستی پێغەمبەر و قاپەكە بەربووەوە و شكا، پێغەمبەر ﷺ دوو پارچە شكاوەكەی هەڵگرت و لكاندنی بە یەكەوە و خواردنەكەی تێ ئەكردەوە ئەیفەرموو : (بیخۆن دایكتان غیرەی كرد) .

جا خواردیان، وە وەستا هەتا خێزانەکەی ئەو قاپەی هێنا کە لە ماڵەکەیدا بوو، دواتر قاپە باشەکەی دا بە ئەو کەسەی کە خواردنەکەی هێنا، وە شکاوەکەی لەو ماڵەدا بەجێهێڵا کە خێزانەکەی شکاندی .

**: غیرەکردن شتێکی ئاساییە و لە نێوان هەموو دوو هاوسەرێکدا ئەبێت هەبێت، چونکە نیشانەی خۆشەویستیەکەی زۆرە بە شێوەیەک کەسەکە حەز ناکات هیچ کەسێکی تر نزیکی هاوسەرەکەی بکەوێتەوە، یان تەنانەت قسەشی لەگەڵ بکات .**

**بەڵام ئەبێت بزانرێت هەموو شتێک کە لە سنووری خۆی دەرچوو خراپ و نەویستراوە، زۆر ئاساییە کە غیرە لە هاوسەرەکەت بکەیت، بگرە شتێکی پێویستە، ئەمەیان ئەبێت بە مایەی زیادبوونی خۆشەویستی نێوانتان، بەڵام غیرەی لە سنوور دەرچوو بە پێچەوانەوەیە، ئەبێت بە مایەی ئیزعاج بوون و بێزاربوون لە یەکتری .**

**پێویستە برایان تەماشای هەڵسوکەوتی رسول الله ﷺ بکەن و وەکو پێشەنگێک تەماشای بکەن لە هەموو شتێکدا، رسول الله ﷺ کە زانی یەکێک لە هاوسەرەکانی تووشی غیرە بووە کە شتێکی ئاساییە، وە کاردانەوەکەی بینی، توورە نەبوو، بەڵکو وەکو شتێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ کرد، چونکە لە ئەسڵدا شتەکە خۆی ئاساییە، لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کاتێک ئافرەت هەرشتێکی کرد پیاو هیچ هەڵوێستی نەبێت، نەخێر زۆر جار هەیە پێویستە هەڵوێستی هەبێت، بەڵام بۆ غیرەکردنێک، یان لەبەر ئەو هەڵچوونەی کە ئافرەتان تووشی ئەبن لە کاتی سووڕی مانگانەدا پیاوان ئەبێت وەکو شتێکی ئاسایی تەماشای بکەن، مەگەر شتەکە لە سنووری خۆی دەربچێت، والله أعلم .**

١٣ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ سُفْيَانَ عَنْ فُلَيْتٍ عَنْ جَسْرَةَ بِنْتِ دِجَاجَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : مَا رَأَيْتُ صَانِعَةَ طَعَامٍ مِثْلَ صَفِيَّةَ، أَهْدَتْ

إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَاءً فِيهِ طَعَامٌ فَمَا مَلَكْتُ نَفْسِي أَنْ كَسَرْتُهُ فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَفَّارَتِهِ فَقَالَ : (إِنَاءٌ كَإِنَاءٍ وَطَعَامٌ كَطَعَامٍ) .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : هیچ چێشتلێنەرێکم نەبینیوە وەکو صفیة بێت، قاپێک خواردنی کرد بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، منیش بەسەر خۆمدا زاڵ نەبووم هەتا شکاندم، جا پرسیارم کرد لە رسول الله ﷺ دەربارەی کەفارەتەکەی، فەرمووی : (قاپێک وەکو قاپێک، خواردنێک وەکو خواردنێک).

---

**: واتە ئەبێت قاپ و خواردنێکی بدەیتێ کە وەکو ئەوەی خۆی وابێت، سەرەڕای زۆری خۆشەویستی رسول الله ﷺ بۆ دایکە عائشة رضي الله عنها ئەمە نەبوو بە ڕێگر لە بەردەم دادپەروەربوونی بەرامبەری .**

١٤ - أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ عَنْ عَطَاءٍ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ : سَمِعْتُ عَائِشَةَ : تَزْعُمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْتَقُلْ إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ : (لاَ بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَلَنْ أَعُودَ لَهُ) .

فَنَزَلَتْ : | يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ | (التحريم) .

| إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ | لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ .

| وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا | لِقَوْلِهِ : (بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً) .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : رسول الله ﷺ لەلای زینب ی کچی جحش ئەمایەوە و هەنگوینی لەلا ئەخوارد، جا من و حفصة پەیمانمان دا بە یەکتر کە پێغەمبەر هات بۆ لای هەرکامان بلّێت : (وا هەست ئەکەم بۆنی مغافیر ت لێدێت، مغافیر ت خواردووە).

جا چوویە لای دانەیەکیان، ئەویش ئەو قسەیەی پێ وت .

جا فەرمووی : (نەخێر، بەڵکو هەنگوینم خوارد لەلای زینب ی کچی جحش، وە ئیتر نایخۆم).

پاشان ئەمە دابەزی : | يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ | .

ئەمەش دابەزی بۆ حفصة و عائشة | إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ | .

| وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا | لەبەر ئەوەی کە فەرمووی : (بەڵکو هەنگوینم خواردووە).

---

: (مغافیر) شتێکی بۆن ناخۆشە .

١٥ - أَخْبَرَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يَحْيَى - هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ - عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتِ : الْتَمَسْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَدْخَلْتُ يَدِي في شَعْرِهِ .

فَقَالَ: (قَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ) .

فَقُلْتُ أَمَا لَكَ شَيْطَانٌ ؟

فَقَالَ : (بَلَى ، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ ) .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : رسول الله ﷺ هات بۆ لام ، منیش دەستم كردە ناو قژیەوە .

جا پێی فەرمووم : (ئەوە شەیتانەكەت هاتەوە ) .

منیش وتم : ئەی تۆ شەیتانت نییە ؟ .

فەرمووی : (بەڵێ ، بەڵام الله زاڵی كردم بەسەریدا و موسوڵمان - یان بێ خراپە - بووە ) .

١٦ - أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ : حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ : أَنْبَأَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ عَنْ عَطَاءٍ قَالَ : أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتِ : افْتَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَظَنَنْتُ أَنَّهُ ذَهَبَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ ، فَتَجَسَّسْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ فَإِذَا هُوَ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ يَقُولُ : (سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ) .

فَقُلْتُ : بِأَبِي وَأُمِّي إِنَّكَ لَفِي شَأْنٍ وَإِنِّي لَفِي آخَرَ .

- عائشة رضي الله عنها ئەڵێت : شەوێك رسول الله ﷺ دیار نەما منیش وا گومانم برد كە ڕۆیشتبێت بۆ لای یەكێك لە خێزانەكانی ، منیش چاودێریم كرد ، كاتێك بینیم لە ڕكوع یان سوجدەدا بوو ئەیفەرموو : (سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ) .

منیش وتم : دایک و باوكم بە فیدات بن، تۆ خەریكی شتێكیت و منیش سەرقاڵم بە شتێكی ترەوە .

١٧ - أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ قَالَ : أَنْبَأَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ : أَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَثِيرٍ أَنَّهُ سَمِعَ مُحَمَّدَ بْنَ قَيْسٍ يَقُولُ : سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ : أَلَاَ أُحَدِّثُكُمْ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَنِّي ؟

قُلْنَا : بَلَى.

قَالَتْ : لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي انْقَلَبَ فَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ ووَضَعَ رِدَاءَهُ وَبَسَطَ إِزَارَهُ عَلَى فِرَاشِهِ وَلَمْ يَلْبَثْ إِلاَّ رَيْثَمَا ظَنَّ أَنِّي قَدْ رَقَدْتُ، ثُمَّ انْتَعَلَ رُوَيْدًا وَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْدًا ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ رُوَيْدًا وَخَرَجَ وَأَجَافَهُ رُوَيْدًا وَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي فَاخْتَمَرْتُ وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي وَانْطَلَقْتُ فِي إِثْرِهِ حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ وَأَطَالَ الْقِيَامَ ثُمَّ انْحَرَفَ وَانْحَرَفْتُ فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ فَهَرْوَلَ فَهَرْوَلْتُ فَأَحْضَرَ فَأَحْضَرْتُ وَسَبَقْتُهُ فَدَخَلْتُ وَلَيْسَ إِلاَّ أَنِ اضْطَجَعْتُ فَدَخَلَ .

فَقَالَ : (مَا لَكِ يَا عَائِشُ رَابِيَةً ) .

قَالَ سُلَيْمَانُ حَسِبْتُهُ قَالَ حَشْيَا قَالَ : (لَتُخْبِرِنِّي أَوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ).

قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ .

قَالَ : (أَنْتِ السَّوَادُ الَّذِي رَأَيْتُ أَمَامِي ) .

قُلْتُ : نَعَمْ، فَلَهَدَنِي لَهْدَةً فِي صَدْرِي أَوْجَعَتْنِي.

قَالَ: (أَظَنَنْتِ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ ) .

قَالَتْ : مَهْمَا يَكْتُمِ النَّاسُ فَقَدْ عَلِمَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ .

قَالَ : (نَعَمْ، إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَتَانِي حِينَ رَأَيْتِ وَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْكِ وَقَدْ وَضَعْتِ ثِيَابَكِ، فَنَادَانِي فَأَخْفَى مِنْكِ فَأَجَبْتُهُ وَأَخْفَيْتُهُ مِنْكِ وَظَنَنْتُ أَنَّكِ قَدْ رَقَدْتِ فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَكِ وَخَشِيتُ أَنْ تَسْتَوْحِشِي فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَ أَهْلَ الْبَقِيعِ فَأَسْتَغْفِرَ لَهُمْ).

- محمد بن قيس وتی : گوێبیستی عائشة بووم رضي الله عنها وتی : ئایا بۆتان بگێڕمەوە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ و خۆم ؟

وتمان : بەڵێ .

وتی : شەوێکیان نۆرەی من بوو، گەڕایەوە و نەعلەکانی لەلای پێی دانا، جلەکانی دانا و عاباکەشی لەسەر شوێنی خەوەکەی ڕاخست، نەمایەوە بە ئەندازەی ئەوە نەبێت وای زانی کە خەوم لێکەوتووە، پاشان بە ئەسپایی نەعلەکانی کردە پێی، وە هەر ئەسپایی عاباکەی هەڵگرت، وە بە لەسەرخۆیی دەرگاکەی کردەوە و چووە دەرەوە و دایخستەوە، منیش خیمارم کرد و پەشتەماڵەکەم دا بە خۆمدا و بەدوایدا ڕۆیشتم هەتا گەیشتە بەقیع .

جا لەوێ سێ جار دەستی بەرز کردەوە و زۆر مایەوە .

پاشان گەڕایەوە و منیش گەڕامەوە، پەلەی کرد و منیش پەلەم کرد، خێراتری کرد و منیش خێراترم کرد، ئەو گەیشت و منیش گەیشتم و پێشی کەوتم، هەر من پاڵ کەوتم یەکسەر هاتە ژوورەوە .

فەرمووی : (ئەی عائِش بۆ هەناسەت سوار بووە ؟).

سلیمان وتی - یەكێكە لە ڕاویەكان - وا بزانم فەرمووی : (خۆت پێم ئەڵێیت یان ئەوەی كە اللطیف الخبیر ؟) .

وتم : ئەی رسول الله باوک و دایکم بەفیدات بن، جا بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە .

فەرمووی : (تۆ ئەو ڕەشاییە بوویت لەپێش خۆم بینیم ؟) .

وتم : بەڵێ .

جا دانەیەکی کێشا بەسەر سنگمدا ئازارم پێ گەیشت .

فەرمووی : (ئایا پێت وا بوو کە الله و پێغەمبەرەکەی زوڵمت لێ ئەکەن ؟).

وتم : مرۆڤەکان چەندە بیشارنەوە الله عز وجل هەر زانیویەتی .

فەرمووی : (بەڵێ، جبریل هات بۆ لام کاتێک بینیت، نەهاتە ژوورەوە لەبەر ئەوەی کە جلەکانت دانابوو، هەربۆیە بانگی کردم و نەیهێڵا تۆ پێی بزانیت، منیش وەڵامم دایەوە و لە تۆم شاردەوە، وە وام زانی نوستوویت بۆیە حەزم نەکرد خەبەرت بکەمەوە، وە لەوەش ترسام کە بترسیت، جا فەرمانی پێ کردم بچم بۆ - گۆڕستانی - بەقیع و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەم) .

https://t.me/afratany_SU

# پێڕست